# سەمفۆنیا





شیعر / 1369

## ساڵح سووزەنی

پێرست

پەپوولە................
دایک.................
دایە گەورە............
بیرهەڵکەن ...........
هیوا .................
مانگ.................
زریبار...............
شەو/...............
زریبار...............
ئاوێنە...............
لیمو................
تابلو................
شەونم.............
شەوزستان.........
حەز...............
سەمفونیا..........
شەهید............
بومباران..........
وشە...............

# سەمفۆنیا...................سالْح سووزەنی


(          )...........................
شێعری نان........................
شەوبۆ...........................
من و شەو و ئەستێرەکان.  .......
شەو..............................
سرەوت..........................
تاریکان..........................
رەوت............................
داوا...............................
وەڵام.............................
شێعر.............................
چیرۆک..........................

## پەپولە:

بۆ پەپوولە

ئاگـــــــر !
هانێ باڵەکانم
پێی هەڵفرە!
لەو پەڕ جەنگەڵ
تاریکایی
دەستی تا لای خوا چووە !

# دایك

پرچت!

بەفری لووتکەکانی چل چەمەیە!

عومرت!

لە چاخی بەردەوە،

تا دابەزین لە جیّ ماچی،

سەر گونای زەدردی یاری مانگ.

بەلاّم دایە!

دریّژایی هەرچی چەمە لە کوردستان ،

بیدە دەم یەك

هەرچی دار بەرووی ولاّتە

بە مشاری بیرەوەریت،
بیبرەوەو بیدەوە دەم یەکێ
هیشّتا بە قەد
دانگێ چاوەروانیت نابێ!

زریّباریش
هاتوو ئەسرینی چاوت بێ
هیّشتا هیوات
بەرزی چیای هیمالایاش
دەبەزێنێ!
دەبەزێنێ...

******

# دایەگەورە

عەرز هێشتا هاڵاوێ بوو

چاوی باران

بۆنی پیازی نەبیستبوو !

جۆگە و چەم و زەریا هێشتا

ژن و ژنخوازیشیان نەبو

باوەگەورەمان «RNA»

چاوە مشقێی «DNA»ی بوو

لەو کاتەوە ،

دایە گەورەم ،

لانکۆڵەکەی دیوەزمە ئەیجوێنی

هەر بوو بەڵام

بەڵام هەر بوو !

## بیرهەڵکەن

کانییـــەکـانیـان
داپـڵـــۆخــــان!
جوگە و هەسیل
ئاخنــــــراون!
زەوی ئەسمم
بۆ ئەوەی
بگەم
بە
زە
ریا.

## هیـــــــوا

هەموو شەویٚ

هیوای کورٍم

دەست لەملی نانیٚك دەكا و

لە سەر كۆپانەكەم

دەنویٚ !

خەونی چای شیرینیكی تر

لە قاوەتوندا !

دەبینیٚ

## مانگ

مانگێک هاتوو

دانە

دانە

ئەستێرەکانی ئاسمانی شارەکەمی

هەموو قووت دا.

مانگێک هاتوو

مانگێک داچوو

# زرێیار

ئاگر

بە رقەوە هاتوو

دار بەڕویەک پیری خوارد و

چوو بە ناو قەد

زرێبارا !

ها..

ها..

ها..

ها..

کوژایەوە.

# شـــــەو

له سەربانی شارەکەوە
بۆ گڵۆپێکی بە سۆ دەگەڕێم
شەوی....
شەوی....
شەوە.
له رۆچنی دێکانەوە
ئەستێرەکانیش ،
وەڵامی چاوم نادەنەوە
نادە...
دەمن چیبکەم

بۆ کویێ بچم
ئەم لام سەر جەمی باکوور
ئەو لام سەر جەمی باشوورە!

# زریێـــــار

من ئارەقی مەمکی یارم
لە سەر گۆپکەی ،
چیاکانی کوردەواری
دیێمە خواریێ
من رووبارم !
من زووخاوی پۆنگ خواردووم

لەناو دڵی دایە گەورەی دڵ سووتاودا

من گۆمەکەی زرێبارم !

***

# ئاوێنە

خەندەیەکم لە سەر پەڕەی لێوم کێشا
چوومە بەر دەم یەکەم دانە
ڕوومەتم جێی هەزار زللەی
پێوە مابوو
دەستێک تاڵە ڕەشەکانی قژی سەرمی
هەلئەکێشا
ژێر پاکانم ،
دووسێ شیوی خوێنی تیا بوو
ئەوی دیکەم ،
دایە دەستی شارێکەوە
خەونێکی ڕەش ،
خوێنی مەمکی یەکیان ئەمژی
لە دوورەوە ئەستێرەیەک
بەرقەوە ئەدرەوشاوە
شریخەیەک ..
ئاوێنەکە،
ورد و قاش بوو.

# لیمۆ

من ئەمهەوێ ،
هەرچی مەمك بە دارەوەن
تێر بگووشم
کەئاغایەك ،
لیمۆیەکی ترش و شیرین ئەمژیت و
فرێیئ ئەدات
رقم لە خۆم هەڵئەسێت و
لە خاوەنی
داربەهێکان !

***

# تابلۆ

گوڵباخیی‌یەک،
لەسەر مێزی
شاعیرێکی رۆمانتیکا
هاتە زمان:
ئەگەرمنت زۆر خۆش ئەوێت!
پیان بڵێ ،
سەرم نەبڕن
لە ناو ئاوی پەرداخێکا
نە مخنکێنن
ولآتەکەم پێشێل نەکەن !

***

# شەونەم

کاتێ کە گوڵ ،
بۆیەکەم جار
تیشکێکی هەتاو ئەبینێ
فرمێسک کوڵمی تەڕ ئەکات و
منی هەژار ئێنێتە کوڵ
بەڵام کە من
هەموو رۆژێ ،
بۆ یەکەم جار
تۆ ئەبینم
نوقم ئەبم
لەگێژاوی
چاوەکانتا
.....

# شەوزستـــــــان

بۆنی ئەم شەوە درێژە کەڕی کردم

دەنگی هەنگاوێ نابینم

لەشەم هەستی گۆرانییەك ،

نایهێنێتە سەمای ئەوین

من چاوەڕێی بۆنی «یاس»م

نە بۆکڵیشەی دەمی «ژاڵە»

شەوزستـــــــانە:

قەڵەشی پێڵاوەکانم

درزی لێفە شڕبووەکەم

هەوری دەمم لەئاسمانی ژورەکەمدا ...

بۆنی تیشکی ئەم لامپایە

کزی کردم

زوقم .. شەختە ....

بایە ... بۆران....

بەهاری دڵ پیاسە ئەکەم

تا بەهاری هەموودڵێ

تاپاییزی هەموو گوڵێ !

# حـەز

بەکێ بڵێم ،

من سەودازەدەی دوو مەلم:

بێ ئارامن

ئاسایشیان لێ سەندووم.

دێن و دەچن:

ناخم حەزێ ئەی هەژێنی.....

وەکوو بەندی

کونی چاویان

ناوە بە مێڵە کانەوە

کراسی بەرت ئەیان گوشێ

بەڵام هەرگیز!

مافی خۆیان لە بیر ناچێ

# سەمفۆنیـــــا

که به ئارشه

ناخی سیمیکی هەڵکۆڵی

هاواری کرد

قامکی یەکەم ،

دەستی یارمەتی بردەسەر

زامی سیمێ

ئێشی سیمی دووهەم سەخت بوو

قامکێکی تر فڕی بۆ لای

ئاخەکان دەستیان دایە دەست

ئاهەنگی گریانێکەوە

ـ بەڵی کێبوو؟

گۆرانی بێژێکی زامار

دلۆپ

دلۆپ

وشەکانی ،

کردە مشتی سازەکەوە .

منی هەژار دەستم بە هیچیان نەدەگەیشت

بۆسۆی دڵم ....

تیشکی سۆزێ دایدوریم و

خستمیە شریتەکەوە..

هونەرمەند:

کە دەستم بە زاڵم ناگا

چۆن ئەتوانم

تیری خەمم بساومە تاری رۆحت !

سازەکە:

هاوار....

هاوار....

قامکی یەکەم:

چیم لە دەست دێ منی هەژار؟

گۆرانی بێژ:

منیش ناخم

پشکۆی ئێشێک،
دەی سوتێنێت
«من لە شاگردانی عەشقم»

***

# شەهید

شاری ماندوو
وا لە داوی پێکهێنراوی
خەوی شەوا ... و
منی بێخەو
تیری چاوی نوێ پشکووتووم،
دەهاوێمە
ئەستێرەکانی شەو بە سۆ
چاودائەگرن
ئەڕۆن..
ئەفڕن..
پرشنگ دەخەن،
پەردەی رەشی ئاسمانی شەو،
بە تیشک دەدڕن.
ئەو باڵندە ئالتوونییە کلک درێژە
کە جار بە جار

## سەمفۆنیا..................سالّح سووزەنی

ئەوەنەی پەڕی باڵەکانی کۆتری چاو
لەیەک دەدرێ
دێ و ڕێ دەبڕێ
وەکو بڵێ
ژیان وابێ چەن ڕەوایە
توانەوەی مۆمی سووتاو
لە سەر عەرزی ڕەشی شەوا
ژینی ئەستیرە ئاوایە
ژینی ئەستێرە ئاوایە.

***

# بۆمباردمان

شارەکەمان سەرتەنووریٚ بیٚ رۆچنی
پڕ دووکەڵە
لەو بانەی وا دویٚ ئیٚوارە
گوڵی سووری کراسی بەرت
نامەی وەرە بۆکۆلّان!ی
/بە بای شەمالّ/
بۆ دەناردم

پەپوو....!

منالّەکان

بە جێی تەقەی

نارنجۆکە بچکۆلّەکانی نەورۆزی و

تەقاندبی «پستانەکان»

”حاجی حەوتەقەی“ بۆمبایان

بۆ تەقاندن!

چنگی رەشی،

بالّندە ئاسنیەکە

پەلاماری هەموو گوڵی شارەکەی دا و

بێ ئەوەی بزانن بۆ چی؟

لەگەڵ پەپوولەکان کوژران

پەنجەرەکان،

داترووسکان!

جلی شووشەیان دادڕان

دەرابەکان

هەڕایان کردە سەر شەقام

هەنگەژالّە

گێژو

وڕو

## سەمفۆنیا..................سالّح سووزەنی

رەنگ بزرِکاو

بەرەو شاری قورِ و چلپا و ....

تۆم دەدی بەلاّم نە بە چاو

کولّمی گەشت،

ببوە رەنگی بەفری بەهار،

دەم بەهاوار:

ئای برا گیان....

چاوە شینە مەنگەکانت،

سەیارەیەکی ئەرِوانی،

بۆ کۆی؟

چوارپا قەلّەوە زلەکان،

پەردەی پارە

ببوە مومی چاونووسانیان

تۆش هەم دیسان،

چاوەرِوانی،

قاڵیچەکەی سولێمان بووی

.....

****

# وشـــــە

«هەر وشەیەک، وەک گوللەیەک،
بۆ تفەنگێکی ئازادیخواز بە کارنەیەت»
(پەشیو)

من ئەتوانم
خۆشەویستی،
لەناو نامەی چاوەکانتا بخوێنمەوە
من ئەتوانم
شەوی رەشی قژی کیژی شێعرەکانم
بە نەرگیسی ئەو بڵێسە
برازینمەوە
شانەی‌کەم پەخشی کەمەوە
من ئەتوانم
سۆز و نەشەی
هۆنراوەیەکی دڵتەزێن
لە هەر وشەی ئیشارەتێک

بدۆزمەوە و

چاك ئەزانم بیدەم لە چاپ

لە سەر

پەڕەی

گوڵی دڵی!

بڵێی بتوانم وەکو تۆ

گوللەیەکی نەتەقێنرا و بتەقێنم

لە لوولەی پێنووسێکەوە

رووەو سینگی داگیرکەری؟

***

«هەموو رۆژی چوارشەمۆیان
دەچمە گۆڕستانی بیرم»
( ئارام)

( ؟ )

هەموو رۆژی،
تۆ بچۆ گۆرستانی بیرت
ئەم شاعیری رۆمانتیکیش
«لەگەلّ شەبەق،
بگری بە سەر
هیوا و ئاوات و تاسەیا»
لە سەر گۆڕی کۆنە هەوار!
مەی ئاشقیش
هەموو شەوێک
چاو لە ئەستێرەدائەگرین
بۆ رۆچنی رۆژ دەئەشقین
هەموو رۆژێ
گوڵی شەبەق
لە سینگ دەدەین
بەرەو جێژوان
/واتە ژیان/دەهەنگاوین..

# شیّعری نان

شەو تا بەیان

وشەکانم

بە خویّنی دلّ پاراو .باران

یەک لەدووی یەک

لە ناو شریتی بە حریّکی عەروزیا

سەما ..مەلە...

بەڵکوو کیّژی شیّعرەکانم

زەردەخەنە

بە سەر لیّوی‌دا هەڵفڕیّ

## سەمفۆنیا..................سالّح سووزەنی

یا خۆ بەناز
چارشێوی کۆنەی فڕێدا و
شیشەی مل و سێوی باخەڵ لێم بسوورێ...

کاتێ غونچەی ڕۆژدەپشکووت
کرێکارێک برسی هاتوو
گوڵە گەنمی شێعرەکانمی
بە کەرەنتوی ڕەخنە بڕی
خەرمانی هونراوەکانمی
دابە بادا
لە بەجێ ماو
تاقە شێعرێکی بۆ نووسیم:
نانەشیعر

***

# من و شەوبۆ

کە منالّ بووم

دایکم گولێکی بۆنخۆشی

گەلاّ سەوزیشەوگولّگەش ی

ناوگولّدانی،زۆرخۆشئەویست

دەستی نازی

کاتێک ئەچووە ئامێزی

زۆربەرێزی ئەو گولّەوە

بەرامەیان

وەك شیری مەمكی خۆی سپی..

دوای ئەوەی فێر بووم بڵێم

نان،ئەشەمزانی بڵێم:

بەبۆ...و ئینجا شەوبۆ

شەوان هاتوو...رۆژان رۆیی ....

منالی خۆم،

وەك ئەو گوللەی

باوكم بۆ خۆی پێی هاوێشتم

دەنا بە سینگی كاتەوە

ئێستە «هیوا»م

ئەوەی دڵی پیشاوی دەرد

ئەوەی باوكی

لەشەوێكی كپ و تاریك و بێدەنگا

هەنگاوێكی بەرەو رۆژ نا

ئەوەی مامی لەناو رۆژا

هەنگاوی نا

ئەوەی كاكی

بە تروپكەوە گیانیدا..

**

كە ئاغات بانگی كرد:

## سەمفۆنیا..................سالّح سووزەنی

شەوبۆ!

تەزی حەزی موچرکەیەك

گیانی گەستم

کەچی بابت

ئەوەی تەنیا بە نووزەیەك

دڵی تۆقی

ئەوەی بابی لە شەوێکا،

بەقەد کێوێ،

زێڕ و پارەی وەگیر هێنا

ئەوەی مامی هەر بە شەودا

سکی بەسەر ئەرزدا دەخشا..

کاکی وەك شەمشەمە کوێرە

لە گزینگی رۆژ دەترسا..

وتی: وەسا!..چەپکە پارە..

شاگردانەکەشی نەدا

«کادیلاك»ەکەی هەڵفڕان.

***

# من و شەو و ئەستێرەکان

له میحرابی کتیبا،
چوومه سوجده
شار نوستبوو
ئەستێرەکان،
تێده فکرین
چوومه ناو شێعرێکی باڵدار
کرنۆش بەرم
بۆ خوای جوانی
بۆ خوای ئەوین و دڵداری،
شار نوستبوو
ئەستێرەکان،
تێکرا چاویان لیّداگرتم

بووم بە گوللە،

بو ناو چەکێک

تەقیمەوە....

شار نوستبوو

ئەستێرە تیشکی دەهاوێشت

منالّەکان راچەلّەکین

بووم بە هاوار،

لە قورگی چەوساوەیەکا

شار نوستبوو

ئەستیرە دەدرەوشانەوە

لاوەکان راپەرین لە خەو

ببم بە چی؟

بچمە ناو چی؟

شەو دامرکێ..

شار گشت هەلّسێ؟

***

# شەو

شەوە!
مەلی باڵ سووتاوی دڵی پڕم
ئەفڕی،
ئەگەر رۆژ بیتەوە
بەڵام بەهاری ئەمساڵە،
پەپوولەیەك باڵ نەخشینە،
وا بە دەزووی جاڵجاڵووكە
بە تروپكی شوورەی شەڕا
هەڵواسراوە!

## سەمفۆنیا..................سالّح سووزەنی

شەماڵ بۆتە کیمیاوی

باران بۆتەن نمە مووشەك

هەورەکان گشت،

ئەقریشکێنن

ناببوورن

قەلەڕەشەی دڵ ئاسنینن

«سەوت» ئەشکێنن

سروە ڕاکە بەیان دووره

ئەم رەشەبا

شەماڵ نییە!

ئەم بەهارە،

وشەیەکی مەکر و فێڵە

گۆرانی دەم رێوییەکانە

خۆر لەو پەڕی ئاسۆدایە و

چاوەروانە......

چاوە.....

***

# سرەوت

باسی منی ماسی
لەگەڵ
چیرۆکی تۆی دەریا وەکوو
قریشکەی تفەنگی هاوارە
لەبێدەنگی شەوەزەنگی ئێستای پاییز
روو بە سینگی شەوەی دووریت
بتەقێتەوە ...
باوان وەرە فریام کەوە!
ماسی دەریا چۆن ئەتوانێت
لە بترییەك ئاوی لێڵا
لە باوەشی ژینا بنوێ؟
ماسی بێ دەریا
ناسرەوێت
قەت ناسرەوێ.

# تاریکان

ئێوارەیە !

دارتێلەکان،

دەستیان کردوتە مل یەک....و

ئەم شوستەیە

بۆنی خەمباری لیوەدی

ئیوارەیە!

کولاّن توورِە .....و

شالاّوی ری

بەرەو ئەستێرە

هەڵدەچی...

پەنجەرەکان

ئەم دیو.... ئەم دیو....

بە نایلۆن و بەتانی رەش

ئاخنراون...

ئێوارەیە و

هەر رێبوارێک و شاعیرێک

لە دڵیان دا

بە تەمەنی شەوی درێژ

پێدەکەنن

# ڕەوت

هیشتا دەوری دەنووکم زەرد،

هەموو شەوێ:

هاوڕێ لەگەڵ ئەستێرەکان

دەجریوێنن

هێشتا باڵم نەگرتبوو،

هەر لەهێلانەکەی خۆما

بەرەو ئاسمان

باڵەکانم رادەشەکاند

لەگەڵ شاردا بلووقیم هات:

ئەونەی تۆزێ، دەستم کردە ملی هەتاو..

......

لە ناکاوا:

شەوەزەنگی....

بەڵام چێژی هەر ئەو ماچە

هەڵمیپڕووکاند

ئۆقرەم نەبوو

ئاخر هەتاو،

دڵی لاویمی دەس بەجێ

هەڵکەند بوو

خۆی بەتەنێ

بەرەو ئەو پەڕی شەوە زەنگ

هەڵفریبوو

نەنووستبووم

بەڵام خولیای ئەوینێکی ئاگراوی

لە زەویدا

نەیهێشتبووم....

جارەهای جار

چاوەکانم وەك ئێشکچییەکی دڵسۆز

بە ئاوەڵا بۆ دەزگیران ڕاگرتبوو

نەهات ...نەهات....

منی مەلی ئەویندارى

خۆنەدەبوو

هەردانیشم

خۆنەدەکرا:

هەر چاوەڕێی هەتاوم بم

لەئەستێرە پاڕامەوە

ـ ئەگەر دەکرێ

باڵە پرشنگدارەکانتم بۆ بنێرە!

هەڵمگرە و

سنوورەکانی شەوەزەنگ

لێک بپچرە!

ئەستێرەیەک لە ئاوێنەی چاوەکانما،

دەنگی خۆم بوو

لە گوێم دا دەزرینگایەوە:

ـ چەکی هاوار و تووڕەییت،

بە پەنجەی هیوات هەلگرە

جووتێ کەوشی پۆڵای ئیمان

لە پێ بکەو

سەربەخۆیی بکە بە تۆشەی ڕێگەی دووررت!

بە لە شاخی پڕ لە بەفری نائومێدی

# سەمفۆنیا..................سالّح سووزەنی

منی مەلی ئەویندارت،

خۆنەدەکرا هەر چاورێی هەتاوم بم

خۆنەدەکرا..................

**

هێشتا تازە

داری نەمامی تفەنگم

پەل و پۆکەی

بە دەور سینگ و پشتوێنمدا

حەڵقە دابوو

گۆرانی رۆژ و ئەستێرەم

تێکەڵ ئاوی کانی دەکرد

بەرەو شارە تاریکەکان

بەرێم دەکرد ....

هەتا ماڵی ئەستێرەکان،

لەگەڵ چەندین هاورێی خولیا،

خوێنی باڵمان تێکەڵاو کرد...

پەنجەکانمان،

قەوی و پڕ هێز

داڵی لە زەوی هەڵدەگرت

بەری تەنیا شابالّێکمان

سێبەری ئەخستە شەر چیا

بەلاّم هیشتا،

رێگە دوور بوو

لەشکەری قەل هێشتا مابوون...

سەدان داویان لە سەر رێ نا

چەندین هاورێی گیانی گیانی گیانیم

بە گوللەی شەو

دەکەوتە باوشی چیا

بەلاّم دارستان هەر مابوو ....

رووبارەکان قورگیان تەڕ بوو

هێشتا هەتاو،

لەبنکەی ئەستێرەکاندا

رچەی هەلّفرینێکی نوێی

بۆ سوّزی ئێمە دادەنا:

ــ چەندین بێچوە هەلّوی عاشق

لەپالْ شاری تارێکیدان

بالّندەیەك ئازا و نەبەز،

بیان هێنێتە بنکەی یەك!

بالّندەکان چاویان گێرا ....

هەموو تێکڕا
چاویان لەسەر منا
وەستا

*

ئێستا،
شادی و
پەپوولە و
من
بە چاو  چاوی یەک ماچ دەکەین
شابالْ دەئاڵێنینە یەک..
پەنجە لە پەنجەی یەک دەسووین..
منی مەلی ئەویندار ی
خۆ نەدەکرا هەر چاوەرێی هەتاوم بم!

**

هێشتا تامی ئەو ماچانەم لە دڵدابوو

له سێ هاورێم دەبوا یەکیان هەڵبژێرم

روانیمه پەپووله و شادیم

دەستم دایه چەکی رفێق..

دیسان من و چیا . کانی...

هەوراز ..گاشەبەردەکانی..

بوڵیند دەفڕیم

داوی گوللەم پێ نەدەگەیشت

هەر رۆیشتم ...

تاگەیشتم.

بەڵام رێگەی گەڕانەوه

دیوارێکی ئاگرین بوو

ئەونەی قژی شەو درێژ و

ئەونەی ریشی شەو بولێند بوو..

هاورێکانم تازه باڵیان دەرکردبوو

قالاو زوی رەشاندبوو

ئاسمان تۆڕێ ئاگرین بوو

من و دۆست و چەك و گولله..

تەقە و مەرگ و من و ئەوین..

گەمارۆ بوو و گیرفانی خاڵی تفنگم..

وتم:

منم سەرکردەیان!

ئەوان هێشتا تازە باڵیان دەرهێناوە

ئەوان هێشتا..

*

وتیان بیبەن ..نەخۆشە بۆ نەخۆشخانە!

نەخۆشخانەم بە فرووزهاورد..

وتیان:

بیبەنە شێتخانە!

وتم خولیای ئەوینێکی ئاگراویم

شێتخانەتان دەسووتێنێ دێوانەییم!

وتیان:

"تەناف"

وتم:

"ملم گوریس چڕە"

وتیان:

گوللە

وتم:

سینگم گوللەدڕە!

وتیان:

بیبەن بیسووتێنن،

خۆڵەکەشی،

لە چۆمێ خەن

وتم:

گیان...گیان...

دیسانەوە دەچمەوە ئامێزی دەریا!

دیسانەوە...

دیسا...

***

# داوا

بۆ بێگەرد..

لە بیرم دێ باوکم دەیگوت:

حەزم لە دایکت شۆڕش بوو!

لەشەر شێعرێک بە بالاّیا

بەندیان کردم

{ئەو شێعرە ئەم چەند دیرە بوو}

هەبوو نەبوو......

منالێکی چەتوون هەبوو

گوێی بۆ باپیران نەدەگرت

داوای ئەستێرەی ئاسمانی شەوی بێرووناکی

دەکرد....

دووسێ جار

فەلاقە کریا

چەندین جار

خرا سەرتەنوور

بەڵام دەهاتە دەرەوە و

دیسان داوای گڕی دەکرد

شەو دەی تۆقاند....

دایدەچڵەکاند.....

گازی لەروومەتی دەگرت....

لیسپێ قژی هەلئەکێشا.....

بەڵام دیسان،

داوای ئەسێرەی شەوی ئەکرد.

منالّەکان!

باوکم خۆی بوو بە ئەستێرە

ئیستا کە من،

بەشوێن گزنگی هەتاو دا ئاوارەم و

دەڕۆم تاکوو..

چەپکە چەپکە....

دەیهێنمەوە

بۆسەردێری شێعرەکانم

# وەڵام

شەوە شەو.......................

های شەوە شەو.................

ـ لەدڵم دا هەتاوێکم حەشار داوە،

بەقەد چاوی

چاوەڕوانی دلدارەکەم!

من ئەو ڕۆژەم کە دی و ..نایی...

من ئەو کەسەم،

دەمری و ..

دیسان دەژییتەوە...

شەوە شەو................

های شەوە شەو...................

ـ لە کوولەکەی سییەکانما،

دەریایەک هەناسەم پێیە!

دابەشی ئەکەم

بە سەر گول.........

بە سەر شارا.......

دەی هەر بێژن:

شەوە شەو های...

شە...وە....شە....وە

ـ بەلەمێکی شرتان پێیە

هاژەی لافاو

دەیشکێنێ!

مەشخەلێکی کۆنتان پێیە،

بایەك دەیکوژێنێتەوە!

شەوە شەو!؟

***

# شیعر

کە شەو دادێ....

دۆشەکەی شێعرێکی کۆنەم

رادەخم و

کتێبێکی پەخشانی کورد

دەکەمە باڵنجی سەرم

شێعرێکی نوێش،

دەدەم بە خۆما و

دێم بنووم...

ـ خەوم نایێ!

شیعری ئاسمان،

دەکەمە پەنجەرەی ژوورم

گوێ رادەگرم

بۆملۆدی

کێشی ئەستێرەکانی شەو....

دەجریوێنن...

چاوەکانم،

وێنەی شێعری رەسم دەکەن

لە سەر پەڕەی شێعری بیرم

شێعری کچم،

دێت و دەڵێ:

بابەگیان!

ئاو ناخوێتەوە؟

برسیت نییە؟

دەڵێم گیانە!

بابۆڵەیەك شێعری تازە

لەگەڵ پەرداخێ شێعری نوێ

لە پاڵ دۆشەکەکەم دانێ!

دێم بنووم و خەوم نایێ....

شێعرێ دەکەم بەهاورێم و
باڵی خەیاڵ لەیەک دەدەین...
بەرەو شاری مێژووی وڵات.....
حەک!
چشێعرێک:
خەمێکی خەست
پاییز...زستان...پاییز...زستان...
ئەقیژێنم:
لەم وڵاتە،
کەس شێعری بەهار نازانێ؟
دەڵێن ساڵێ...رێبەندانێ...
داوای ئەو ئیدی....
کەس شێعری بەهار نازانێ
دێم بنووم و.....
خەوم نایێ....
شێعرێک دەکەم بە فرۆکە،
بۆ ساڵانی
دوای دووهەزاری زایێنی...
بێ پەساپۆرت هەڵم دەگرێ
بۆ پایەتەختی کوردستان

## سەمفۆنیا..................سالّح سووزەنی

شێعری کۆترە سپیەکەیە،

لەسەردەمی،

منالّەکانی نیشتمان....

دیسانەوە،

دێم بنووم و.....

بەلاّم ئەمجار:

لە خۆشیانا

خەوم نایێ......

خەوم ...

***

# چیرۆك

منالّەكان!

قالاْوێك،

چوو بۆ لای شێر و وتی:

گەورەم!

دووسێ كۆتری یاخی دوێ شەو

دار و دیواری جەنگەلّیان،

كرد بە شەونامەی دژی تۆ!

شێر تووره بوو:

ـ لەگەلْ سیچل رێوی برۆ و

هەزار كۆتری دارستانم بۆ بكەن بە شێو!

كە رۆیشتن....

شیر لە بەر خۆیەوە دیگوت:

كەسێ بوختان بۆ بالْندەی هاوگەل بكا، قەت بەقای

نابێ بۆ ئێمەش.

دەبێ.هەر سبحەینێ بیخۆم ....

